# ئازاردانی دایك

## دەبێتە هۆكار بۆ تورەبوونی خوای پەروەردگار

نووسینی : ئازاد تەوحیدی

بسم اللَّه الرحمن الرحيم

إن الحمداللَّه، نحمدُك ربي ونستعينُك ونستغفرُك ونتوبُ إليك، سبحانك ربَّنا وبحمدك، أمرتَنا ألا نعبُد إلا إياك وبالوالدَين إحسانًا، بذلك قضَى ربُّنا ووصَّانا.

ئەچینە خزمەت بەسەرهاتێکی کاریگەر دەربارەی ئازاردانی دایك کە لە فەرموودەیەکی پیرۆزی پێغەمبەری خوا (صلى اللَّه عليه وسلم) هاوەڵی بەرێز ابو هُرَيْرَةَ (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە: قَالَ: رَسُولُ اللَّه (صلى اللَّه عليه وسلم) « كَانَ رَجُلٌ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ، يُقَالُ لَهُ جُرَيْجٌ، وَكَانَ جُرَيْجٌ رَجُلاً عَابِدًا فَاتَّخَذَ صَوْمَعَةً فَكَانَ فِيهَا فَأَتَتْهُ أُمُّهُ وَهُوَ يُصَلِّي فَقَالَتْ يَا جُرَيْجُ، فَقَالَ: يَا رَبِّ أُمِّي وَ صَلاَتِي، فَأَقْبَلَ عَلَى صَلاَتِه فَانْصَرَفَتْ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَتَتْهُ وَهُوَ يُصَلِّي فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ فَقَالَ يَا رَبِّ أُمِّي وَ صَلاَتِي فَأَقْبَلَ عَلَى صَلاَتِه فَانْصَرَفَتْ فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ أَتَتْهُ وَهُوَ يُصَلِّي فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ أُمِّي وَصَلاَتِي، فَأَقْبَلَ عَلَى صَلاَتِه فَقَالَتِ اللَّهُمَّ لاَ تُمِتْهُ حَتَّى يَنْظُرَ إِلَى وُجُوه الْمُومِسَاتِ، فَتَذَاكَرَ بَنُو إِسْرَائِيلَ جُرَيْجًا وَعِبَادَتَهُ وَكَانَت امْرَأَةٌ بَغِيٌّ يُتَمَثَّلُ بِحُسْنِهَا

فَقَالَتْ إِنْ شِـــئْتُمْ لأَفْتِنَنَّهُ لَكُمْ قَالَ: فَتَعَرَّضَــتْ لَهُ فَلَمْ يَلْتَفِتْ إِلَيْهَا فَأَتَتْ رَاعِيًا كَانَ يَأْوِى إِلَى صَــوْمَعَتِهِ فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نَفْســهَا فَوَقَعَ عَلَيْهَا فَحَمَلَتْ فَلَمَّا وَلَدَتْ قَالَتْ هُوَ مِنْ جُرَيْجٍ، فَأَتَوْهُ فَاسْـــتَنْزَلُوهُ وَهَدَمُوا صَوْمَعَتَهُ وَجَعَلُوا يَضْرِبُونَهُ فَقَالَ مَا شَأْنُكُمْ؟ قَالُوا زَنَيْتَ بِهَذِهِ الْبَغِيِّ فَوَلَدَتْ مِنْكَ فَقَالَ: أَيْنَ الصَّـــبِىُّ؟ فَجَاءُوا بِهِ فَقَالَ: دَعُونِى حَتَّى أُصَلِّىَ فَصَلَّى فَلَمَّا انْصَرَفَ أَتَى الصَّبِىَّ فَطَعَنَ فِى بَطْنِهِ وَقَالَ يَا غُلاَمُ مَنْ أَبُوكَ قَالَ فُلاَنٌ الرَّاعِى قَالَ: فَأَقْبَلُوا عَلَى جُرَيْجٍ يُقَبِّلُونَهُ وَيَتَمَسَّحُونَ بِهِ وَقَالُوا نَبْنِى لَكَ صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ قَالَ: لاَ أَعِيدُوهَا مِنْ طِينٍ كَمَا كَانَتْ فَفَعَلُوا) (أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ (٢٤٨٢)، ومُسْلِمٌ، (٦٤٥٥).

واته: هاوەڵی خۆشـــەویســـت أَبِى هُرَيْرَةَ (ڕەزای خوای لێبێت) دە فەرموو ێت: پێغەمبەری خوا (صـــلى اللّه عليه وســـلم) فەرمووێەتی: پیاوێك هەبوو لە ئوممەتانی پێش ئێوە (لە بەنی ئیسرائیل)، پێی دەووترا جورەیج، جوەریج پیاوێکی خواپەرست بوو، شـوێنێکی بۆ خۆی دابین کردبوو (لەو شـوێنەدا بەندایەتی تێدا دەکرد بۆ خوا)

جارێکیان جورەیج نوێژی دەکرد (نوێژی سوننەت) دایکی هات بۆلای و پێی ووت: کوڕم جورەیج، جورەیج لە دڵی خۆیدا ووتی: پەروەردگار دایکم یان نوێژەکەم، ئینجا نوێژەکەی هەڵبژارد (واتە: بەردەوام بوو لە سەر نوێژەکەی)، دایکی ڕۆیشت، بۆ بەیانی بە هەمان شێوە دایکی هاتەوە و جورەیج نوێژی دەکرد، پێی ووت: کوڕم جورەیج، ئەویش ووتی: پەروەردگار دایکم یان نوێژەکەم، ئینجا نوێژەکەی هەڵبژارد (بەردەوام بوو لە سەر نوێژەکەی)، دایکی ڕۆیشت، بۆ بەیانی بە هەمان شێوە دایکی هاتەوە و جورەیج نوێژی دەکرد، پێی ووت: کوڕم جورەیج، ئەویش ووتی: پەروەردگار دایکم یان نوێژەکەم، ئینجا نوێژەکەی هەڵبژارد (بەردەوام بوو لە سەر نوێژەکەی)، ئینجا دایکی ووتی: خوایە مەیمرێنە تاوەکو ڕوخساری داوێن پیسان دەبینێت، بەنی ئیسرائیلیەکان کەوتنە باسکردنی جورەیج و بەندایەتیەکەی، وە ئافرەتێك بەد ڕەوشت (داوێن پیس) هەبوو کە نموونە بوو لە جوانیدا، ئافرەتەکە ووتی: ئەگەر ئێوە بتانەوێت ئەوا من جورەیج لە خشتە دەبەم و توشی فیتنەی دەکەم،

ئینجا ئافرەتەکە چوو بۆ لای جورەیج و (ڕێگەی پێگرت بەوەی کاری داوێن پیسی ــ لەگەڵدا بکات)، بەڵام جورەیج گوێی پێ نەدا، ئافرەتەکەش چوو بۆ لای شوانێك کە ئەو شوانە سەردانی جورەیجی دەکرد، ئافرەتەکە لەگەڵ شـــوانەکەدا کاری داوێن پیسی کردو سکی پڕبوو (واتە: حامیلە بوو لەو شوانە)، کاتێك کە منداڵەکەی بوو، ئافرەتە داوێن پیسـەکە ووتی: ئەم منداڵە لە جورەیجـە، ئینجـا خـەڵکـەکـە چوون بۆ لای جورەیج و ئـەو شـــوێنەی کە جورەیج بەندایەتی تێدا دەکرد ڕووخاندیان و تێکیاندا، وە دەســتیان کرد بە لێدانی جورەیج، جورەیجی خواپەرســـت ووتی: چیتانە بۆچی وام لێدەکەن و لێم دەدەن؟ خەڵکەکەش ووتیان: تۆ لەگەڵ ئەم ئافرەتە کاری داوێن پیسیت کردووە و منداڵت لێی بووە، جورەیج ووتی: کوا منداڵەکە؟

خەڵکەکەش منداڵەکەیان بۆهێنا، جورەیج ووتی: وازم لێ بێنن با نوێژ بکەم، پاشان نوێژی کردو کاتێك لێ بووەوە ، هات بۆلای منداڵەکە و دەســـتی هێنا بە ســـکی منداڵەکەداو ووتی: کوڕە باوکت کێیە؟!

منداڵەکەش هاتە زمان و ووتی: فڵانە کەسی شـــوان، ئینجا خەڵکە کە ڕوویان کردە جورەیج و ماچیان دەکردو دەستیان پێدا دەهێناو پاشـــان خەڵکەکە بە جورەیجیان ووت: شـــوێنێك (جێگەیەکت) بۆ دروست دەکەینەوە لە ئاڵتون و زیو؟! جورەیج ووتی: نەخێر، بەڵکو وەکو خۆیم بۆ لێبکەنەوە کە لە گڵ دروست کرابوو، خەڵکەکەش شوێنەکەیان بۆ دروستکردەوە.

## چەند سوودو ئامۆژگارییەك لەم چیرۆكەدا.

(١) وەڵامدانەوەی دایك لە پێشترە لە نوێژی سوننە ت، چونكە وەڵامدانەوەی دایك پێویست (واجب)ە ، وە واجب و پێویست پێش سوننەت دەخرێت.

(٢) گیرابوونی پاڕانەوەی دایك، پێغەمبەری خوا (صلى اللَّه عليه وسلم) فەرموویەتی:
(ثَلاثُ دَعَوَاتٍ مُسْتَجَابَاتٌ لا شَكَّ فِيهِنَّ: مِنْها: وَدَعْوَةُ الْوَالِدِ عَلَى وَلَدِهِ) صَحِيح: أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد وَالتِّرْمِذِيّ، وَصَحَّحَهُ الشَّيْخ الأَلْبَانِي فِي صَحِيح الْجَامِع (٣٠٣١).
واتە: سێ نزاو پاڕانەوە هەیە وەڵامدراوەن هیچ گومانێكی تێدا نییە: لەوانە: پاڕانەوەی دایك لە منداڵكەی یان بۆ منداڵەكەی.

(٣) هەر كەسێك ڕاست بكات لەگەڵ خوادا ئەوا هیچ بەڵاو فیتنەیەك زیانی پێ ناگەیێنێت.

(٤) بەهێزی باوەڕی جورەیج منداڵێکی تازە لە دایك بوو دێتە قسە بەهۆی پاڕانەوەکەی.
(٥) هەر کەسـێك لە کاتی خۆشـیدا اللّٰه تعالی بناسـێت و بەندایەتی بۆ بکات، ئەوا اللّٰه تعالی لە کاتی تەنگانەدا بە تەنگێیەوە دێت .
(٦) هەر کەسێك کاری داوێن پیسی و بەد ڕەوشتی بکات، ئەوا سومعە و ڕێز و سەنگی نامێنێت لەناو خەڵکیدا.
(٧) تاقیکردنەوەی خوای پەروەردگار بۆ بەندە صـاڵحەکان، تاچە ندە ئارامگرن بەرامبەر بە ناڕەحەتی دونیا، هەروەك چۆن جورەیجی خواپەرسـت تاقیکرایەوە بەوەی کە ماڵەکەیان ڕووخاندو تێکیانداو دەستیان کرد بە لێدانی و قسەی ناشیرین پێی.
(٨) نوێژ تەنها تایبەت نەبووە بەم ئوممەتەوە ، بەڵکو ئوممەتانی تریش نوێژیان لە سـەر بووە، بەڵام جیاوازی هەبووە لەگەڵ نوێژی ئەم ئوممەتەدا.

(٩) مرۆڤی باوەڕدار لە کاتی ناخۆشی و ئازارو پەژارەدا پەنا دەبات بۆ نوێژ، اللَّه تعالی فەرموویەتی: (وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ )( البقرة ٤٥) واتە: وە پشت ببەستن بە نوێژو ئارامگرتن (بۆ گەیشتن بە ئامانج).

وە پێغەمبەری خوا (صلی اللَّه علیه وسلم) ئەگەر کارێکی ناخۆش و ناڕەحەت بهاتایەتە پێشی ئەوا نوێژی دەکرد (إِذَا حَزَبَهُ أَمْرٌ صَلَّى)حَسَن: أَخْرَجَهُ أَبُودَاوُد، وَحَسَّنَهُ الشَّيْخ الأَلْبَاني فِي صَحِيح الْجَامِع (٤٧٠٣) .

(١٠) لە دوای هەموو ناڕەحەتی و ناخۆشییەك خۆشی و ئاسوودەیی بەدوادا دێت .

(١١) دروستە بیرکردنەوە لە ناو نوێژدا بۆ وەڵامی کاری بەرژەوەندی وەك چۆن: جورەیجی خوا پەرست دەی ووت: پەروەردگار دایکم یان نوێژەکەم، ئینجا نوێژەکەی هەڵدەبژاردو بەردەوام دەبوو لە سەر نوێژەکەی، وە یان کاتێك نوێژی لێ تێك دەچێت بیر لەوە بکاتەوە ئایا سوژدەی سەهوو ببات یان نا، چونکە لە بەرژەوەندی نوێژەکەیە.

(١٢) فێڵ و نەخشە و پیلانی ئافرەتی داوێن پیس زۆر گەورە و مەترسی دارە.

(١٣) خۆ بەکەم زانین و دونیانەویستی جورەیجی خواپەرست بەوەی کە خەڵکەکە پێیان ووت: شـــوێنێك (جێگە یەکت) بۆ دروســـت دەکەینەوە لە ئاڵتون و زیو؟! جورەیج ووتی: نەخێر، بەڵکو وەکو خۆیم بۆ لێبکەنەوە کە لە گڵ دروست کرابوو.

والحمدللّهِ رب العالمين، وصلى اللّهِ على خاتم النبيين، وإمام المتقين، وقائد الزاهدين، وسيد الفصحاء، ورأس البلغاء، وخطيبهم إذا وفدوا، والشفيع المشفع إذا وقفوا، وعلى آله وصحبه أجمعين.






